# ماناكانی شكست وسەركەوتن .. لە جیهاد دا ؛

- شیخ یوسف العییري؛ ڕەحمەتی خوای لێبێ

## ماناكانی سەركەوتن -

یەكەم: ئەوەیە كە موجاهید ڕووی كردە خاكی جیهاد، ئەوا سەركەوتنی بەسەر نەفسی خۆی وهەشت خۆشەویستەكانی ئایەتەكەی سوورەتی تەوبە [٢٤] ولقەكانیان بە دەست هێناوە، ئەو هەشت خۆشەویستەی خوای پەروەردگار باسیان دەكات ودەفەرموێت: {قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ} – پێیان بڵێ: ئەگەر باوو باپیرانتان و براكانتان و هاوسەرانتان و عەشرەت و هۆزتان و ماڵ و سامانێك كە بەدەستان هێناوە، یاخود بازرگانیەك دەترسن كە شكان و بێ بازاڕی ڕووی تێبكات و خانووبەرە و كۆشك و تەلارێك كە حەز دەكەن لێتان تێك نەچێت و دڵخۆشن پێی، لاتان خۆشەویستترو نازدارتر بێت لە خواو پێغەمبەرەكەی و جیهادو تێكۆشان لەپێناو ڕێبازی ئەو زاتەدا، دە ئەوە چاوەڕوان بن، هەتا خوای گەورە دێت بە فەرمانەكانیەوە و (تۆڵەتان لێ دەسێنێت)، خوای پەروەردگاریش هیدایەت و ڕێنموویی قەومی یاخی و لە سنوور دەرچوو نادات.

دووەم: ئەوەیە کە موجاهید هەر لەو کاتەوە سەرکەوتنی بەسەر شەیتان دا بەدەست هێناوە، کە فەرموودەی پێغەمبەر سەلماندوویەتی شەیتان لەسەر دەروازەو ڕێگەی جیهاد کردندا وەستاوەو خەڵکی لێ لا ئەدات .

سێیەم: ئەوەیە هەر لە کاتی دەرچوونییەوە سەرکەوتنێکی تری بە دەست هێناوە، چون بووە بە یەکێك لەو کەسانەی خوای پەروەردگار دەربارەیان دەفەرموێت: {وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنا وَإِنَّ اللهَ لَمَعَ المحْسِنِينْ} - ئەوانەش لە پێناوی ئێمەداو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمە؛ هەوڵ و کۆششیان کردووە و خۆیان ماندوو کردووە، سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوانە ڕێنموویی دەکەین بۆ هەموو ڕێگەیەکی چاك و دروستی خۆمان (کە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمەی لەدوایە)، بێگومان خوای پەروەردگار هەمیشە لەگەڵ چاکەکارانە - هیدایەتیش گەورەترین سەرکەوتنەو یەکەم هەنگاوە بەرەو بەهەشت .

چوارەم: ئەوەیە هەر لەگەڵ دەرچوونییەوە بۆ جیهاد، بەسەر ئەو کەسانەی دەوروبەری سەرکەوتووە کە خەڵك سارد دەکەنەوەو بە هەموو ڕێگەو فێڵ وفرتێکەوە خەڵك لە جیهاد لائەدەن .

پێنجەم: جێگیر بوونی موجاهیدیش لەسەر ڕێبازی جیهاد بۆ خۆی سەرکەوتنێکی ترە، لەگەڵ ئەو هەموو ناخۆشی وبەڵاو سەختی وئەو هەموو ساردکردنەوەو پشت لێکردنەی دووچاری دەبێتەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {يُثَبِّتُ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللهُ مَا يَشَاء} - خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار دەکات لەسەر گوفتاری بەجێ و دروستیان لە ژیانی دنیادا، لەسەرەمەرگ و لە قیامەتیشدا، (باوەڕی دامەزراو فریایان دەکەوێت و) گوفتاریان ڕێك و پێك و دامەزراو دەبێت و بەئیمانەوە دەمرن، لەولاشەوە هەر ئەو خوایە ستەمکاران گومڕا دەکات و ئەوەی

پەروەردگار بيەوێت هەر ئەوە پێش دێت و دەكرێت - بۆيە هەر كەسێك پێى لەسەر ڕێبازى جيهاد دا جێگير بوو وئەم شەعيرەتەى ئەنجامداو ئەهلى ئەم ئايەتە بوو، بە ڕاستى سەركەوتوو وسەرفراز بووە.

شەشەم: سەركەوتنى موجاهيديش لەوەدا دێتە جىَ كاتێك كە گيان وكات ومالّ وسامانى خۆى لە پێناو بنەماو بير وباوەڕ وسەرخستنى عەقيدەو دينەكەى دەبەخشىَ، چونكە فيداكارى وقوربانى دان بۆ ئەم دينە بۆ خۆى سەركەوتنە، چ لە واقيعدا زالّ بوو وچ دوژمنەكەى بەسەريدا زالّ بوو .

حەوتەم: لە ماناكانى سەركەوتن ئەوەيە كە خواى پەروەردگار بە بەلّگەو حوجەت وڕوونكردنەوەو بەيانەوە بەندەكانى خۆى سەردەخات، چونكە بە جيهاد كردن حەق دەردەكەوێت وشەكاوە ئەبىَ، وەك چۆن سەركەوتنى غولامەكەى أصحاب الأخدود سەركەوتنى حەق وڕاستى بوو .

هەشتەم: ماناى سەركەوتن ئەوەيە كە خواى پەروەردگار دوژمنى موسولّمانان بە سزاو بەلآيەك لە لايەن خۆيەوە لە ناو بەرێت‌و، جيهادى موجاهيدان هۆكار ئەبێت بۆ ڕوودانى ئەو سزاو بەلآيە، وەك ئەوەى بەسەر گەل وقەومى پەيامبەران دا ئەهات .

نۆيەم: لە ديمەنەكانى سەركەوتن ئەوەيە كە جيهاد كردن دەبێتە هۆى هەژارى كافران ومردنيان بە كوفرەوەو هيدايەت نەدانيان، كە يەكێكە لە مەزنترين جۆرەكانى سەركەوتن، كاتێك كە دژايەتى كردنيان بۆ دين وڕوو بەڕووبوونەوەى موجاهيدان ئەبێتە هۆكارى گومڕايى وڕۆچوونيان لە كوفردا تا ئەو كاتەى مردنيان بەسەردا دىَ، وەك ئەوەى بەسەر

فیرعەون وقەومەكەی داهات بە هۆی دوعاو پاڕانەوەی موسا وهارون ــەوە سەلامی خوایان لێبێ .

دەیەم: لە دیمەنەكانی سەركەوتن ئەوەیە كە خوای پەروەردگار بەندەكانی خۆی بە شەهید ئەگێرێتەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {وَتِلْكَ الأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَتَّخِذَ مِنْكُمْ شُهَدَاءَ وَاللهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ} - ئێمە ئەو ڕۆژگارانە دەستاو دەست پێ دەكەین لەناو خەڵكیدا (تا لە جیهانی واقعیشدا) ئەوانەی باوەڕیان هێناوە خوا دەریان بخات و هەندێكتان بكات بە شایەت و بە پلەی شەهیدی بگەن، بێگومان خوا ستەمكارانی خۆش ناوێت - هەر بەندەیەكیش كە خۆی ماندوو ئەكات وهەوڵ وكۆشش ئەدا بۆ ئەوەیە كە بچێتە بەهەشتەوە، جیهاد كردنیش نزیكترین ڕێگەی بەهەشتە، شەهید بوونیش مەزنترین سەركەوتنی موجاهیدە كە بەدەستی دێنێت وپێی ئەگات.

یازدەهەم: لە دیمەنەكانی سەركەوتنیش سەركەوتنی مەیدان وگۆڕەپانی شەڕە، كە هەموو خەڵك لە مانای ئەگاتو، زۆرێكیان سەركەوتن هەر لەو خاڵەدا تەسك دەكەنەوە كە كێشەو گرفتێكە لە تێگەیشتنی چەمكی سەركەوتن دا، بۆیە پێویستە مرۆڤ تەواوی جۆرەكانی سەركەوتنی پێشوو وئەوەی لە مانای ئەواندایە كۆیكاتەوەو لە خۆیدا بیانهێنێتە جێ.

## ماناكانی شكست هێنان

یەكەم مانای شكست هێنان؛ شوێنكەوتنی میلەتی كافران یا شوێنكەوتنی هەواو ئارەزوویانە :

**خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ اليَهُودُ وَلَا النَّصَارى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُم قُلْ إِنَّ هُدَى اللهِ هُوَ الهُدَى وَلَإِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ العِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ} - هەرگیز جولەكە و گاورەكان لە تۆ (ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم)، ئەی ئیماندارا) ڕازی نابن، هەتا بە تەواوی شوێن ئاین و بەرنامەیان نەكەویت، پێیان بڵێ: بەڕاستی هەر بەرنامەی خوا (ئاینی ئیسلام، شایستەی ئەوەیە كە هەمووولایەكمان شوێنی بكەوین) هیدایەتی ڕاست و دروست هەر لای ئەوە، خۆ ئەگەر شوێن ئارەزووەكانی ئەوان بكەویت پاش ئەوەی زانیاری و زانستیت پێگەیشتووە، ئەوە بزانە كە لە لایەن خواوە هیچ سەرپەرشتیاری و یارمەتییەكت دەست ناكەوێت - هەروەها خوای پەروەردگار لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: {وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ العِلْمِ إِنَّكَ إِذَاً لَمِنَ الظَّالِمِين} - سوێند بەخوا ئەگەر تۆ شوێن هەواو ئارەزووی ئەوان بكەویت، دوای ئەوەی زانیاری تەواوت پێڕاگەیەنرا لەم بارەیەوە، بێگومان تۆ دەچیتە ڕیزی ستەمكارانەوە - بۆیە كە موسوڵمان هەڵدەگەڕێتەوەو شوێنكەوتنی خۆی بۆ میلەتی جوولەكەو دیان وهەر میلەتێكی كافری تری وەك عەلمانی وبەعسی وكۆمونیستی ومۆدێرنێتی ڕادەگەینێت، چ شوێنكەوتنێكی یەكجارەكی وتەواو بێ یا بە شێوەیەكی جوزئی ولە بەشێكی تایبەتدا بێت، ئەوە بە بەرزترین ئاست وجۆرەكانی شكست هێنانەوە دائەنرێت، با جوولەكەو دیان ومیللەتانی كوفریش لێی ڕازی بن وبا دەوڵەمەندی وسەركردایەتی وپێشڕەوێتی بەدەست بێنێ، كە نەدەكرا بێ شوێنكەوتنی میلەت ورێبازی ئەو كافرانەوە پێیان بگات.**

## **دووەم** **مانای شكست هێنان؛ مەرایی وماستاو كردنە بۆ كافران [مُداهَنَة] :-**

**خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {فَلَا تُطِعِ المكَذِّبِينَ وَدُّوا لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُون} - تۆ هەرگیز بەقسەی ئەوانە مەكە كە باوەڕیان بە تۆ نیەو بەرنامەكەی تۆ بەدرۆ دەزانن، ئەوانە ئاواتەخوازن كە تۆ نەرمی بنوێنیت ئینجا ئەوانیش نەرمی بنوێنن - خوای پەروەردگاریش كە دەفەرموێت؛ {فَلَا تُطِعِ المكَذِّبِينَ} - تۆ هەرگیز بەقسەی ئەوانە مەكە كە باوەڕیان بە تۆ نیەو بەرنامەكەی**

تۆ بەدرۆ دەزانن - ئەوە مەبەستی خوای پەروەردگار ئەوەیە کە هەر شتێك پێچەوانەی حەق نەهی لە پێغەمبەرەکەی کردووە شوێن بە درۆخەرەوانی دینەکەی بکەوێت - کە کافرانی مەکەن - ئیمامی قُرْطُبِي ڕەحمەتی خوای لێبێ لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێ (١٨/٢٣٠): "خوای پەروەردگار نەهی لە پێغەمبەری ئەکات بەلای کافرانەوە لار بێتەوە، کافران ئەو کات داوایان لێ دەکرد لێیان گەڕێتو ئەوانیش وازی لێ بێنن، لەوێدا خوای پەروەردگار ئەوەی بۆ ڕوون کردەوە کە لار بوونەوەی مرۆڤ بە لای کافران دا کوفرە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: **{**وَلَوْلَا أَنْ ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدْتَ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئًا قَلِيلا**}** - خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان پایەدارو دامەزراو نەکردایە، ئەوە بەڕاستی نزیك بوویت کەمێك بە لایاندا مەیل بکەیت و بەدڵی ئەوان بکەیت – لێرەشدا خەڵکانێك بە گومڕاییدا چوونە کە پێیان وابووە ئەو مەرایی کردن وماستاو کردنەی حەرام کراوە **[**مُداهَنَة**]** هەر خودی ئەو موداراتەیە کە جائیزە، بۆیە بە نەفامی بێ یا خۆ لەگێلی دان بێ بە ناوی موداراتی شەرعییەوە خۆیان لە دەرگای شکست خواردنەوە داوە ."

بۆ ئەوەی پرسەکەش ڕوونکەینەوە دەڵێین؛ (مُداراة) شتێکەو (مُداهَنَة) شتێکی ترە، کە مُداراة بە پێچەوانەی مُداهَنَة جائیزە، موداراتیش ئەوەیە لەگەڵ بەرامبەرەکەت لە قسەو گوفتاردا نەرم ونیان بیت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دان بە گومڕایی وباتیڵ وئەو جۆرە شتانەوە نەنێیتو، هەر کە باسەکە چووە سەر بابەتێکی وا ئیتر لە بابی موداراتەوە ئەچێتەوە سەر بابی موداهەنە، بۆیە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەو فەرموودەی کابرای ئەعرابی دێتە لای ومۆڵەت وەردەگرێ بێتە ژوورەوەو پێغەمبەر دەفەرموێت: (بِئْسَ أَخُو العَشِيرَة – بەڕاستی پیاوی خراپ ونابەجێیە ) وپاشان مۆڵەتی پێ ئەدا بێتە ژوورەوە، پێغەمبەر لەوێدا نە گومڕایی ئەڵێت ونە گومڕاییش دەسەلمێنێ، چونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەو کارەیدا نەکەوتۆتە هیچ گوناە وتاوانێکەوە، بەڵکو لادانی شەڕ وخراپەیە، بەڵام بە ڕێگەو شێوازێکی شەرعی بێ ئەوەی تێکەڵ بە گوناە وتاوانەوە بێت، چەندین فەرموودەش باسی

موداراتی خەڵكیان كردووە چونكە ئەو موداراتە لەویداو لە هەندێك حاڵەتدا دیمەنێكە لە دیمەنەكانی ڕەوشتی جوان وئەخلاقی بەرزەوە لەگەڵ خەڵك .

جیاوازی نێوان مودارات ومواداهەنەش لەوەدایە كە مُداراة ؛ بەخشینی دونیایە بۆ خێر وچاكەی دونیا، یا بۆ خێری وچاكەی دین،و یا بۆ هەردووكیان پێكەوە، كە حەلالەو جار وا هەیە داواكراویشە. بەڵام مُداهَنَة؛ واز هێنانە لە دین بۆ بەدەستهێنانی خێر وچاكەی دونیاوە. لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ كە شكستی زۆرێك لەو خەڵكەی خۆیان نسبەت بە ئیسلامەوە دەدەن لەوەدایە كە مواداهەنەی دوژمنانی خوای پەروەردگاریان كردووە، كاتێك كە فریوی خۆیان وخەڵكیش ئەدەن بەوەی كارەكەیان موداراتێكی شەرعییەو، كەچی لە شكستێكی ڕەش ومواداهەنەیەكی كوێرانە زیاتر نییە، مواداهەنەیەكە كە حەقی تێدا كراوە بە باتڵ وگومڕایی، وگومڕایی تێدا بە حەق ناسێنراوە .. دین بۆ خێر وخۆشی دونیا وخۆشگوزەرانی وبەرژەوەندی تاكەكەسی بێ ئەرزشەوە بەخشراوە .. ئیدی كە شكستێكی ئاوا هەبێ سەركەوتن چ ماناو مەفهوومێكی بۆ دەمێنێتەوە ؟

**سێیەم** مانای شكست هێنان؛ مەیل ولار بوونەوەیە بەرەو كافران وخاوەن گومڕایی وباتڵەوە :

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {وَإِنْ كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِيْ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُ وَإِذاً لَاتَّخَذُوكَ خَلِيلاً وَلَوْلَا أَنْ ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدْتَ تَرْكَنُ إِلَيْهِم شَيْئَاً قَلِيلاً، إِذاً لَأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الحَيَاةِ وَضِعْفَ المِمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيراً} - ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم موشریك و هاوەڵگەران خەریك بوو تۆ لابدەن لەوەی كە بەوەحی و نیگا بۆمان ڕەوانە كردوویت، تاشتێكی ترمان بۆ هەڵببەستیت و شێوازی كارو بانگەوازت بگۆڕیت، ئیتر ئەو كاتە ئەگەر بەقسەی ئەوان بكەیت ئەوان تۆ دەكەنە هاوەڵ و خۆشەویستی خۆیان (چونكە بەدڵی

ئەوانت كردووە)! .. خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان پايەدارو دامەزراو نەكردايە، ئەوە بەڕاستى نزيك بوويت كەمێك بە لاياندا مەيل بكەيت و بەدڵى ئەوان بكەيت .. ئەو كاتە ئيتر دوو بەرامبەرى (هاوەڵگەران) لە دنياداو بە دوو بەرامبەرى ئەوان لە دواى مردن سزاو ئازارمان پێ دەچەشتيت، پاشان كەسيشت دەست نەدەكەوت فريات بكەوێت و لەدەستى ئێمە رزگارت بكات - بۆيە ئەوەى كە خۆى بە لاى كافران وزاڵمان دا ئەدا، جگە لەوەى كە موژدەى ئاگر وسزاى دوارۆژى پێدراوە، ئەوە بەو لار بوونەوەى بەرەو كافران وگوێڕايەلى كردنيان پڕ بە دەمى خۆى شكستى ڕەشى خۆى ڕاگەياندووەو، بە هەموو خەڵكى ئەڵێت؛ كە ئەو بنەماى دەستى پێوە گرتبوو لە دواى ئەو لار بوونەوەو گوێڕايەلى كردنەى ون بوو ونەماو سڕايەوە. ئينجا با لە دوادا ئەوە بڵێت؛ كە من دەستبەردارى بنەماو نەگۆڕەكانى خۆم نەبووم .. ئەوە لار بوونەوەى بەرەو كافران يا زاڵمان وگوێڕايەلى زاڵمان يا كافران بە درۆى دەخاتەوەو شكستى ئەو كابرايە ڕادەگەيەنێت وئەوەى پێ ئەڵێت؛ كە كردار پێچەوانەى بنەماو بير وباوەڕ بوو ئەو بنەمايانە هيچ ماناو ڕاستييەكيان نامێنێ، چونكە لە لاف وبانگەشەيەكى باتڵ وحبرێك لەسەر كاغەزدا زياتر نابن، بۆيە قەت باسى بنەماو بير وباوەڕ ولار بوونەوە بەرەو كافران وزاڵمان وگوێڕايەلى كردنيان لە ويست وخواستەكانيان دا پێكەوە كۆ نابنەوە، چونكە ئەوە لە شكستێكى سەرشۆڕكەر زياتر نييە .

ئەوەى بە ورديش لە ماناكانى پێشووى شكست وسەركەوتن دا بڕوانێ، زۆر بە ڕوونييەوە نەفامى ئەو كەسانەى بۆ دەردەكەوێ كە لافى شكستى ئيمارەتى ئيسلامى ئەفغان لێئەدەن، چونكە ئەوەى ورد لەو مانايانە دا تێڕامێ ئەزانێ كە ئيمارەتى ئيسلامى وئەميرى ئيمانداران ملا محمد عومەر بەسەر هەموو جيهاندا سەركەوتن وخواى پەروەردگار بە فەزڵى خۆى زۆربەى ماناكانى سەركەوتنى پێ بەخشين وخواى پەروەردگار لەوەى پاراستن كە ماناكانى شكست ودۆڕان بيانگرێتەوە، لە خواى گەورە دەپاڕێينەوە موجاهيدان جێگيركات وسەركەوتنيان لە مەيدان دا پێ ببەخشێت، خواى پەروەردگار خۆى خاوەنى ئەوەيەو تواناى بەجێ گەياندنى هەيە .

بۆیە پێویستە موسوڵمان دەست بە بنەماو بیر وباوەڕی خۆی بگرێت وسەرەڕای ناخۆشی وزامەکانییەوە ئەوە ڕاگەینێت کە ئەو بەرز وبراوەو سەرفرازە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنْتُمُ الأَعْلَوْنَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ، إِنْ يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِثْلُهُ وَتِلْكَ الأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَتَّخِذَ مِنْكُمْ شُهَدَاءَ وَاللهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ} ـ (ئەی ئیمانداران) کۆڵ مەدەن و ساردمەبنەوە و خەفەت مەخۆن، چونکە هەر ئێوە سەربەرزو سەرفرازو سەرکەوتووترن ئەگەر ئیمانداری چاك و ڕاست و دروست بن .. ئەگەر زام و سەختی و ناخۆشیەك تووشی ئێوە هاتووە، ئەو خەڵکەش تووشی هەمان زام و سەختی و ناخۆشی هاتن، ئێمە ئەو ڕۆژگارانە دەستاو دەست پێ دەکەین لەناو خەڵکیدا (تا لە جیهانی واقعیشدا) ئەوانەی باوەڕیان هێناوە خوا دەریان بخات و هەندێکتان بکات بە شایەت و بە پلەی شەهیدی بگەن، بێگومان خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت.

والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه أجمعين



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @GizingNet

١٤٣٨ - ٢٠١٧